هەڵمەتێك بۆ ناساندنی

# سُورَةُ الأَنعَامِ

سورەتی ئەنعام

Al An'am Surat




نوسینی : إحسان برهان الدين

بسم الله الرحمن الرحيم

## ناسنامەی کتێب

**ناوی پەرتووک: هەڵمەتێك بۆ ناساندنی سورەتی (الأنعام)**

**نووسینی: احسان برهان الدین**

**نەخشەسازیی ناوەوە: عبدالله خاکی**

**نەخشەسازیی بەرگ: محمد سیانی**

بسم الله الرحمن الرحيم

## هەڵمەتێك بۆ ناساندنی سورەتی (الأنعام)

ساڵانێکی زۆرە  لە کوردستاندا ئیش لەسەر ئەوە دەکرێت قورئان بەبێ عەقیدە پێشکەشی موسوڵمانان بکرێت، واتە گرنگی زیاتر بە چیرۆك و بەسەرهاتی پێغەمبەران (علیهم السلام) و باسی ئیعجاز و عیبادەت و تەشریعەکان بدرێت، هاوکات بە مەبەست و پلانێکی بەرنامە بۆ داڕێژراو، چەندین لایەنی تری قورئان بۆ نموونە ئەوەی پەیوەندی بە تەوحیدی ئولوهییەتەوە هەبێت، یان بەرائەت دەربڕین لە بێباوەڕان وزۆر لە باسەکانی تری ئیمان وحاکمیەت فەرامۆش کراوە.

بۆیە ئێستا هەر بانگخوازێك بیەوێت بانگەوازێکی ڕاستەقینە بۆ ئیسلام بکات، پێویستە گرنگی بەو لایەنە بدات کە هەمیشە دەسەڵاتە عەلمانییەکان دژایەتییان کردووە لە ڕێگەی مامۆستایانی ئایینی ودەستەی فەتواکانی سەربەخۆیان و هەندێ جاریش لەڕێگەی هەندێ لە بزوتنەوە وحیزب وڕێکخراو و کەسایەتی سەربەخۆیان کە بەڕواڵەت وسیما موسوڵمانن و لە ناوەڕۆك و

حەقیقەتیشدا لیبرالی وعەلمانی دەماکدارن و لە زۆربەی جیهانی ئیسلامیشدا بوونیان هەیە و درێژە پێدەری دوور خستنەوەی خەڵکین لە بیروباوەڕی ڕاستی قورئان و سوننەت و ڕێبازی سەلەف.

هەموو ئەوانە توانییان خەڵکی لە بنچینەو بنەما هەر بەهێزی ئیسلام کە عەقیدەو تەوحیدە دوور بخەنەوەو وا وێنایان بۆ بکەن کە ئیسلام - هاوشێوەی دینی نەساڕاکان - بریتییە لە کۆمەڵێك ئاداب وڕەوشتی جوان و عیبادەت و شەعائیر وهیچی تر.

من پێشنیار دەکەم وەکو دەستپێکێکی گشتگیر کە هەموو دڵسۆزێکی بانگەوازی تەوحید لە مامۆستایان و فێرخوازانی زانستی شەرعی وبانگخوازانی ڕێگای حەق، هەر یەکەو بە گوێرەی توانا و پێگەی خۆی وبە شێوازی گونجاو لەگەڵ بەهرە و تواناکانیاندا کار لەسەر ئەم بابەتە بکەن کە ئەویش ئەوەیە بە هەموو شێوەیەك تیشك بخرێتە سەر ناساندن و تەفسیر و ڕوونکردنەوەی تەوەرەکانی سوڕەتی الأنعام لە قورئانی پیرۆزدا، چونکە ئەو سوڕەتە بەڕێزە درێژترین سوڕەتەکانی قورئانە کە باس لە عەقیدە و تەوحید دەکات وهیچ زێدەڕەوی نییە بڵێم زۆربەی

کورد لە تەوەرە گرنگەکانی ئەم سورەتە هێشتا بێ ئاگان، وەکو چۆن لە بیروباوەڕ و تەوەرەکانی تری تەوحید لە قورئانی پیرۆزدا بێ ئاگاش نەبن شارەزاییەکی زۆر کەم وناتەواویان هەیە.

ئەم سورەتە بە تێگەیشتنی من ئەگەر هەموو تەوەرەکانی شیبکرێنەوەو ئاسان بکرێن و لە تەفسیرە موعتەبەرەکانەوە واتاکانی بەپوختی بەخەڵکی بگات قەناعەتم وایە گۆڕانکاری باش لەناو کۆمەڵگادا درووست دەکات وهیچ نەبێت دەبێتە سەرەتایەکی زۆر باش بۆ ئەوەی چیدی بابەتەکانی عەقیدە لە قورئاندا فەرامۆش نەکرێن..

ئامانجی سورەتی الأنعام بە شێوەیەکی گشتی خستنەڕووی تەوحیدی پاك وبێ گەردە و بڕیاردانە لە سەر ڕاستییەکانی تەوحید، باسی ألوهیة و پەیامی ئیسلام و زیندووبوونەوەی دوای مردن و پاداشت دەکات، هەروەها دڵنەوایی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ دەکات بۆ ئەوەی لەسەر ناخۆشییەکانی بانگەوازکردن بۆ تەوحید ئارام بگرێت و شوێنکەوتووی پێغەمبەرانی پێش خۆی بێت لەو بارەوە. ئەم سورەتە بەرپەرچی شیرك و موشریکان و بێ باوەڕان دەداتەوە، بەڵگەکانیان پوچەڵ دەکاتەوە،

موجادەلەیان لەگەڵدا دەکات وبەشێوازی جۆراوجۆر بەڵگەکانی تەوحید دەخاتەڕوو، باسی سەرگەورەمان إبراهیم باوکی پێغەمبەرانی تێدایە (علیه السلام)، کە چۆن بانگەواز بۆ عەقیدەی تەوحید دەکات ولە کۆتاییدا بەشیکراوەیی باسی ئەو دە ڕاسپاردە دەکات کە هەموو پێغەمبەران (علیهم السلام) ئاراستەی ئوممەتەکانی خۆیانیان کردووە.

پێشنیاری من لێرەدا ئەوەیە هەڵمەتێکی گشتگیر ئەنجام بدرێت بۆ ناساندن و ڕاڤە کردن و بە جوان خستنەڕووی تەوەرەکانی ئەم سوڕەتە مەزنە، بۆ نموونە لە ڕێگەی:

- دابەش کردنی سورەتەکە و پێشکەشکردنی بە وانەی نووسرا و بینراو وبیستراو.

- کردنەوەی خولی تایبەت بە تەفسیری ئەو سوڕەتە کە بێگومان کاریگەری باشی دەبێت بۆ ناسین وناساندنی تەوحید وموەحیدان هەروەها ناسینی شیرك و موشریکان.

* ئەنجامدانی هەڵمەتێك بۆ لەبەر كردنی ئەو سورەتە و دیاری كردنی خەڵاتی جیاواز لەلایەن دەوڵەمەندەكانەوە بۆ ئەوانەی بەشێكی یان نیوەی یان هەموو ئەو سورەتە لەبەر ئەكەن.

* لەم بارەشەوە ڕێكخراوەكان بە گشتی وڕێكخراوەكانی ئافرەتان بە تایبەتی كارێكی زۆر گونجاو دەبێت گرنگی بەو سورەتە بدەن لە ڕووی جوان خوێندنەوەو تەجویدو بلەبەركردن وتەفسیرو ڕوونكردنەوەی موفرەداتەكانی و هەڵێنجانی وانەكانەكانی لە ڕووی تەوحید و ئیمانەوە.

* بەكارهێنانی تەوەر وباسەكانی ئەم سورەتە لەلایەن ئەو مامۆستا بەڕێزانەی گرنگی بە باسەكانی عەقیدە ئەدەن بۆ ئاسانكردنەوەو سوود لێ وەرگرتنی بۆ وتاری هەینی و پێشكەش كردنی لە زنجیرەیەكی پوخت و ئاساندا بۆ نموونە لە بیست وتاری هەینیدا.

- بەش بەش کردن و پێشکەش کردنی وەکو وانە بە بەبەرنامەی پاوەر پۆینت و بە داتاشۆ، چونکە ڕێگایەکی ئاسانکاری باشە بۆ گەیاندنی ئامانج و پەیامی ئەو سوڕەتە..

- درووست کردنی (مطوية)ی ڕەنگاوڕەنگ و بە دیزاینی جوان و سەرنجڕاکێش بۆ خوێنەران، لەبەر ئەوەی بەداخەوە زۆربەی موسوڵمانان تاقەتی خویندنەوەیان نییە.

- هەڵبژاردنی هەندێ بابەت تێیدا و ڕونکردنەوەی بە وێنە بۆ منداڵان.

- درووست کردنی هێڵکارییەکی هونەری و جۆرێك لە (تشجیر) و پۆلینکردنی ڕێکوپێك بۆ هەمو بابەتەکانی ئەو سوڕەتە لە ڕێگەی وەرگرتنی زانیاری لەو کتێبانەی باسی ناوەڕۆك و تەوەرەکانی ئەوە سوڕەتەیان بەشێوەیەکی زانستی و پوخت کردووە.

- ئاسان کردنی بابەتەکانی لە ڕێگەی درووست کردنی بەرنامەی تفاعلي، تەنانەت ئەگەر کەسانی شارەزا بتوانن بە کوردی ئەپڵیکەیشنێکی بۆ درووست بکەن بۆ سیستمەکانی ئادرۆید و ئای ئۆ ئێس بەردەست بیت کارێکی خێر و گەورەیە و (صدقة جارية)یە.

- وەرگێڕان و پوخت کردنەوەی ئەو تەفسیرانەی بۆ سورەتی الأنعام کراوە کە جەختیان لەسەر لایەنی عەقیدی و مەنهەجی لەو سورەتە کردووەتەوە.

- ئەنجامدان وتایبەتکردنی خێوەتگە وگەشتی زانستی بە لەبەر کردن و تەفسیری ئەم سورەتەوە.

- خستنەڕووی واتاکانی بیروباوەڕ لەو سورەتەدا لە ڕێگەی دیزاین کردنی وینەی سەرنج ڕاکێش بۆ خوێنەران لە شێوەی زنجیرەیەکدا کە بەش بەش و بە وێنە پێشکەشی خوێنەران بکرێت.

- بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان بۆ گەیاندنی ئەم بابەتە وەکو هاندانێك بۆ بڵاوبوونەوەی بە مەبەستی جێبەجێکردنی ئەو خاڵانەی سەرەوە.